سلسلة القادة و الفاتحون

فاتح مصر

# عەمری کوڕی عاص

شکێنەر و بەزێنەری ڕۆم و ڕزگارکەر و یەکەمین ئەمیری خاکی مصر ﵁



دانانی

منصور علي عورابي

ئامادەکردن و وەرگێڕانی

يحيى ذبيح الله

(سلسلة القادة و الفاتحون)

زنجیرەی ژیانی پیاوە گەورەکانی مێژووی ئیسلامی
لە جەنگ و جیهاد و ڕزگارکردنی زەوی

(فاتح مصر)

# عەمری کوڕی عاص

شکێنەر و بەزێنەری ڕۆم و ڕزگارکەر و یەکەمین ئەمیری خاکی مصر

ڕەزای خوای لەسەر بێت


دانانی

منصور علي عرابي

ئامادەکردن و وەرگێڕانی

یحیی ذبیح الله

بسم الله الرحمن الرحيم

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا, من يهده الله فلا مظل له, ومن يظل فلا هادي له, أما بعد..**

**عەمری کوڕی العاص (ڕەزای خوای لەسەر بێت), ژیر و دانای قوڕەیش, و ڕزگارکەری خاکی مصر.[١], و یەکێك لە گەورە پیاوانی عەرەب, بە نمونە دەهێنرایەوە لە وردبینی و زیرەکیدا, پاش ڕێکەوتننامەی حودەیبییە (صلح الحديبية) موسوڵمان بوو, وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆر بە موسوڵمان بوونەکەی دڵخۆش بوو, و سەرکردایەتی بەشێك لە سوپاکەی پێ سپارد, وە کاتێکیش شاری (عوممان).[٢] تەسلیم بە موسوڵمانان بوو، پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) عەمری کرد بە ئەمیری ئەوێ, و شایەتی لێهاتوویی و ئیمانداری بۆدا, کاتێ فەرمووی** ((ابنا العاص مؤمنان :عمرو وهشام)) **واتە: دوو کوڕەکەی العاص ئیماندارن, عەمر و هیشام)).**[٣][أحمد], **هەروەها فەرموویەتی** ((عمرو بن العاص من صالحي قريش، نعم أهل البيت أبو عبد الله، وأم عبد الله، وعبد الله)) **واتە: عەمری کوڕی العاص لە پیاو باشەکانی قوڕەیشە, باشترین خێزان باوکی عبداللە و دایکی عبداللە و عبداللە یە)).**[٤] [أحمد].

**کاتێکیش أبو بکر(ڕەزای خوای لەسەر بێت) بوو بە خەلیفە عەمری کرد بە سەرکردەی یەکێك لەو سوپایانەی کە جەنگی هەڵگەڕاوەکان(المرتدين)یان کرد و یەکێك لەو سەرکردانە بووە کە جیهادی خاکی (شام).[٥]یان کردووە, لەسەر دەستیدا حەلەب و ئەنتاکیە و چەندین شوێنی تریش ڕزگارکرا..**

---

[١] **لە نەخشەی ئیسلامیدا خاکی (میصر) بە (کینانە) هاتووە.**

[٢] **عوممان دراوسێ خاکی یەمەنە، لە نەخشەی ئیسلامیدا بەم وڵاتانە ئەوترێت جەزیرەی عەرەبی، یان نیمچە دوورگەی عەرەبی، کە پێك هاتوون لە حەوت وڵاتی سەربەخۆ، ئەوانیش خاکی حیجاز کە ئێستە گۆڕاوە بە سعودیە، یەمەن، عوممان، قەتەر، ئیمارات، بەحرەین، کوەیت. وە ئەم نیمچە دوورگەیە لە نەخشەی جیهانیدا بە گەورەترین نیمچە دوورگە دادەنرێت.**

[٣] ) صحيح: رواه احمد، وصححه الالباني رحنع الله في السلسلة الصحيحة برقم ١٥٥ و ١٥٦

[٤] ) صحيح: رواه احمد، وصححه الالباني رحمه الله في صحيح الجامع الصغير برقم ٤٠٩٥

[٥] **) زاراوەی (شام) لە نەخشەی ئیسلامیدا هاتووە، کە ئێستا گۆڕاوە بۆ هەر چوار وڵاتی: فەلەستین، لوبنان، ئەردەن، سوریا، پاش ئیستعمارو داگیرکردنی لەلایەن ڕۆژئاواوە.**

لەسەردەمی الفاروق(عومەری کوری خەتتاب)یشدا (رەزای خوای لەسەر بێت), عەمر خاکی مصری ڕزگارکرد و بوو بە والی ئەوێ, پاشان عوثمانی کوڕی عەفان (رەزای خوای لەسەر بێت) لای برد و گەڕایەوە بۆ شام و ماوەیەك لەوێ مایەوە.

وە لە سەردەمی معاویەدا (رەزای خوای لەسەر بێت) عەمر دووبارە بوویەوە بە ئەمیری خاکی مصر و لەوێ مایەوە هەتاوەکو لەسالّی ٤٣ك(٦٦٤ز) لە قاهرە کۆچی دووایی کرد.

لە پەڕەکانی دواتردا زیاتر شارەزا دەبین دەربارەی ڕزگارکەری مصر و یەکەمین ئەمیری؛ أبو عبدالله, عەمری کوڕی العاص.

# لەدایکبوونی عەمر و گەورەبوونی

عەمری کوڕی العاص لە شاری مەککە لە ساڵی ٥٠ی پێش کۆچی(٥٧٤ز) لە دایکبووە, لە باوکێکی قوڕەیشی, باوکی عەمر (العاص کوڕی وائل السهمي)یە, سەرکردەی هۆزی(بني سهم)بووە کە لقێکە لە قوڕەیش, دایکی عەمریش کە بە (النابغة) ناسرابوو(سلمی کچی حرملة)یە لە هۆزی(بني عنزة), دیل بووبوو لە بازاری عوکاز لە مەککە فرۆشرا، العاص کری و عەمری لێ بوو.

عەمر لە بارێکی دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانیدا گەورە بوو, باوکی کەسێکی دەوڵەمەند بوو, عەمر فێری نووسین و خوێندنەوە بوو, هەر لە منداڵییەوە بە بیرتیژی و زیرەکی و یەکبڕیاری و زۆری فێڵ ناسرابوو, هەروەکو چۆن ناسرابوو بە چاونەترسی و ئازایەتی و سوارچاکی, لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر حەزی لە سەروەتوسامان و سەرکردایەتی و دەسەڵات بووە.

عەمر لە سەرەتای گەنجێتیدا کاری بازرگانی کردووە, بنچینەکانی لە باوکییەوە وەرگرتووە, باوکی عەمر تووشی تەنگەشەیەکی ئابووری بوو, بەجۆرێك کە زۆربەی سەروەت و ماڵەکەی لەدەستدا بەهۆی بەخشینی بۆ چارەسەرکردنی دوژمنایەتییەکان و هەروەها لە ڕێگەی خراپەکاری و ئارەزووبازییدا, ئەم بارودۆخە عەمری ناچارکرد کە کاری قەصابی بکات, بۆ ماوەیەك وەکو قەصاب کاری کرد لە مەککەدا هەتا سەروەتەکەی زیادی کرد پاشان گەڕایەوە بۆ بازرگانی, دواتر لەگەڵ ئافرەتێکی قوڕەیشی هۆزەکەی خۆیدا هاوسەرگیری کرد, کە ئەویش(ریطة کچی منبه کوڕی الحجاج السهمي)یە, عبدالله ی لێ بوو کە گەورەترین منداڵی بوو.

# باڵوێزی قوڕەیش لە حەبەشە

کاتێك عەمر گەیشتە تەمەنی ٣٧ ساڵی بانگەوازی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەستی پێکرد, عەمر لەگەڵ العاصی باوکیدا هەڵوێستی کەللەڕەقی و بەرەنگاربوونەوەیان هەبوو بەرامبەر بە ئیسلام, یەکێك بوو لەو سەرکردانەی شیرك، کە زۆر دوژمنایەتی بانگەوازی ئیسلامیان دەکرد و هەوڵی کوژاندنەوەی نوری خودایان دەدا, دەستیانکرد بە ئەزیەتدانی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان, وچەوساندنەوەی بێهێزەکانیان,

بۆیە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد بە هەندێك لە هاوەڵەکانی کۆچ بکەن بۆ حەبەشە بەو پێیەی لەوێ پادشایەکی دادپەروەری لێیە, کەس لای ئەو ستەمی لێ ناکرێ, بۆیە هەندێك لە هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە بەسەرکردایەتی (جعفری کوڕی أبو طالب), و لەوێ خواپەرستییان دەکرد.

کاتێك قورەیش بە کۆچکردنی موسوڵمانانیان زانی لە (دار الندوة) کۆبوونەوە و دەستیانکرد بە ڕاوێژکردن, (عەمری کوڕی العاص)یشیان تێدا بوو, پێشنیازکرا کە وەفدێك لە قورەیش بە چەندین دیارییەوە بچێت بۆلای النجاشي(پادشای حەبەشە), پاشان دەربارەی ئەو موسوڵمانانە قسەی لەگەڵ بکەن کە لەلای ئەون, جا ئیتر لە دڵیدا ڕق و کینە دروست دەبێت بەرامبەریان و دەریان دەکات, ئەمانیش دەیان هێننەوە بۆ مەککە و سزایان دەدەن هەتاوەکو لە دینەکەیان پاشگەز دەبنەوە, هەموویان لەسەر ئەم پێشنیارە ڕازی بوون و بڕیاریان دا کە عەمری کوڕی العاص هەستێت بەم کارە لەگەڵ چەند گەنجێکی دیکەی قورەیشدا, چونکە دەیانزانی کە پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ پادشای حەبەشەدا هەیە, لەگەڵ ئەوەشدا کە کەسێکی دانا و فێڵبازە, عەمر دەستی کرد بە ئامادەکاری سەفەر, دیارییەکانی ئامادەکرد, و دەرچوو بۆ سەفەرەکەی بەو هیوایەی ئەوە بۆ قورەیش بەدەستبهێنێت کە ئاواتەخوازی بوو, کاتێك گەیشتە حەبەشە بەشێك لە دیارییەکانی دا بە هەندێك لە (بەتاریك) قەشەکان بۆ ئەوەی پشتی بگرن و نەجاشی ڕازی بکەن بەوەی کە دەیەوێت, پاشان داوای بینینی نەجاشی کرد و ئەویش ڕێگەی پێدا, کاتێك عەمر چووە ژوورەوە نەجاشی بەخێرهاتنی کرد و پرسیاری لێکرد دەربارەی ئەو شتانەی کە پێیەتی, ئەویش دیارییەکانی پێشکەش کرد, نەجاشی سوپاسی کرد و دەربارەی حاڵی خۆی و قەومەکەی(عەرەب) پرسیاری لێکرد, عەمریش ئەم پرسیارەی بە هەلێکی لەبار زانی هەتاوەکو داواکارییەکەی بکات, وتی کە لە مەککەدا پیاوێك دەرکەوتووە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکات و بیروباوەڕی عەرەبی تێکداوە و دووبەرەکی خستۆتە نێوان خەڵکەوە, پاشان باسی ئەوەی بۆ کرد کە کۆمەڵێك لە شوێنکەوتووانی پەنایان بردووە بۆ حەبەشە و لەوێ ماونەتەوە و قورەیشیش دەیەوێت کە بیانگێڕێتەوە و سزایان بدات, بەڵام نەجاشی ڕازی نەبوو بە داواکارییەکەی عەمر هەتا گوێ لە لایەنەکەی تریش نەگرێت, بۆیە بانگی موسوڵمانەکانی کرد, موسوڵمانەکان هاتن و (جعفری کوڕی أبو طالب) پێشیان کەوتبوو, جعفر دەستی کرد بە قسە و بەرگریکردن لە

براکانی و لە بانگەوازی ئیسلام, ئەم قسانە بووە هۆی ئەوەی کە نەجاشی ڕەتی بکاتەوە موسوڵمانان ڕادەستی عەمر بکاتەوە, عەمر بە غەمباری هاتەدەرەوە بەڵام بیری لە فێڵێکی تر کردەوە؛چوو بۆ لای قەشەکان و پێی ڕاگەیاندن کە ئەوانە نکۆڵی خوایەتی (عیسا) دەکەن و دەڵێن ئەویش مرۆڤێکە, هەرایەك دروست بوو, وە هەستان و عەمریان لەگەڵ خۆیاندا بردەوە ژوورەوە بۆ لای نەجاشی، و هەواڵیان پێدا دەربارەی ئەوەی کە عەمر وتبووی, ئەویش دووبارە موسوڵمانانی بانگکردەوە, وتی: دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم چی دەڵێن؟ جەعفەر چەند ئایەتێکی سەرەتای سورەتی (مریم)ی خوێندەوە و پاشان وتی: ئەو پێغەمبەری خودایەو, وشەیەکی خودایەو ڕۆحێکە لەلایەن ئەوەوە, نەجاشی بەم قسانە زۆر سەرسام بوو, وتی: سوێند بەخوا بەم شێوەیەیە, و (عیسا)ش هەرگیز لاینەداوە لەوەی کە بەندەیەکی خودا بێت, پاشان بەڵێنی ئەوەی دا بە موسوڵمانەکان کە لەلای ئەو بمێننەوە لە ئەمن و ئاسایشدا, گرنگیشی نەدا بەوەی کە قەشەکان دەیان وت, عەمریش بە شەرمەزاری گەڕایەوە بۆ مەککە و پیلانەکەشی شکستی هێنا, عەمر بەردەوام بوو لە دوژمنایەتی توندی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم), هەتا ئەو کاتەی باوکی(العاصی کوڕی وائل)کۆچی دوایی کرد.

## موسوڵمانبوونی عەمر

پاش کۆچی دوایی (العاصی کوڕی وائل) عەمر دانیشت و بیری لە کاروباری ئەم ئیسلامە دەکردەوە, دەیبینی کە موسوڵمانان ڕۆژبەڕۆژ بەهێزتر دەبن, و سەرکەوتنی خواییان لەگەڵدایە, هەستیکرد کە ئیسلام ڕێگای حەقە, و پەیامی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم)ڕاستە, بۆیە بڕیاری موسوڵمانبوونی دا, ئەمەش لەدوای ڕێکەوتننامەی حودەیبییە, لە سەرەتای (صفر)ی ساڵی ٨کۆچی بەرەو شاری مەدینە دەرچوو, گەیشت بە (خالیدی کوڕی الولید)و(عثمان کوڕی طلحة) ئەوانیش هەمان مەبەستیان هەبوو, هەرسێکیان بەیەکەوە ڕۆیشتن, عەمر لە مەدینەدا گەیشت بە پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) و موسوڵمان بوو, وە بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) لەسەر جیهاد کردن, پێغەمبەری خوداش(صلی الله علیه وسلم) زۆر بە موسوڵمانبوونەکەی دڵخۆش بوو, وە دەیزانی

که ڕاستگۆیه له ئیمانەکەیدا, بۆیه فەرمووی: ((أسلم الناس وآمن عمرو بن العاص)).[أحمد] واته: خەڵکی موسوڵمان بوون و عەمری کوڕی العاصیش ئیمانی هێنا)).[6]

## باشترین بەندەی چاکەکار

دوای ئەوەی که عەمر موسوڵمان بوو, هاوەڵایەتی پێغەمبەری خودای(صلى الله عليه وسلم) دەکرد, و بەردەوام له نزیکی بووە و لێوەی فێر بووە و له ئاینی خودا شارەزا بووە, تا ئەوە بوو پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) هەڵی بژارد بۆ سەرکردایەتی سوپایەك که بەرەو (ذات السلاسل) دەڕۆیشت, چونکه کۆمەڵێك له هۆزی (بني قضاعة) لەوێ بوون و خۆیان ئامادە کردبوو بۆ هێرشکردنەسەر مەدینه, و دوژمنایەتی کردنی موسوڵمانان, بۆیه پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) سوپایەکی ئامادە کرد و پاشان بانگی عەمری کرد و پێی فەرموو: ((إني أريد أن أبعثك على الجيش, فيسلمك الله و يغنمك, وأرغب لك رغبة صالحة من المال)). من ئەمەوێت به سەرکردەی سوپاکه بتنێرم, خوای گەورە ئەتپارێزێت و غەنیمەتت پێدەبەخشێت, وە هیواخوازی سەروەتم بۆت هیوایەکی باش)). عەمر لەوە ترسا که پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وا گومان بەرێت که ئەو سەروەت و سامانی له ئیسلام زیاتر خۆشدەوێت, وتی: ((ئەی پێغەمبەری خودا, من لەبەر سەروەت و سامان موسوڵمان نەبووم, بەڵکو موسوڵمان بووم لەبەر ویستم بۆ ئیسلام, و لەبەر ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا بم)), پێغەمبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) دڵنیای کردەوە که ئەوە دەزانێت, بەڵام تەنیا خێری بۆی دەوێت, فەرمووی: ((يا عمرو, نعما بالمال الصالح للرجل الصالح)) واته: ئەی عەمر, خۆشحاڵی بۆ پیاوێکی چاکەکار که سەروەت و سامانی چاکی هەبێت)).[أحمد و الحاكم][7], عەمر و (٣٠٠) پیاو دەرچوون, کاتێك گەیشته (ذات السلاسل) بینی که دوژمن ژمارەیەکی زۆری کۆکردۆتەوە, بۆیه عەمریش داوای یارمەتی له پێغەمبەری

[6] ) صحيح: رواه الترمذي، وصححه الالباني رحمه الله في صحيح مشكاة المصابيح برقم ٦٢٣٦

[7] ) صحيح: رواه احمد والحاكم، وصححه الالباني رحمه الله في مشكاة المصابيح برقم ٣٧٥٦.

تەواوی فەرموودەکە بەم جۆرە هاتووە:

((عن عمرو بن العاص قال أرسل إلي رسول الله صلى الله عليه وسلم أن اجمع عليك سلاحك وثيابك ثم ائتني قال فأتيته وهو يتوضأ فقال يا عمرو إني أرسلت إليك لأبعثك في وجه يسلمك الله ويغنمك وأزعب لك زعبة من المال . فقلت يا رسول الله ما كانت هجرتي للمال وما كانت إلا لله ولرسوله قال نعما بالمال الصالح للرجل الصالح)).

خوا(صلى الله عليه وسلم) کرد, ئەویش کەتیبەیەکی بۆ نارد کە هاوەڵانی پایە بەرز (أبو بکر و عومەر و أبو عوبەیدەی کوڕی الجراح)ی تێدابوو ڕەزای خوایان لەسەر بێت, جەنگ ڕوویدا و (قضاعة) تێکشکا, عەمریش سوپاکەی بە سەرکەوتوویی گێڕایەوە و غەنیمەتێکی زۆریشیان چنگ خستبوو.

دوای ڕووداوەکەی (ذات السلاسل) پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) عەمری نارد بۆ (سواع) بۆ ڕووخاندنی بتێك کە دەپەرسترا, ئەویش ڕووخاندی, پاشان نامەیەکی پێدا نارد بۆ بانگەوازکردنی(جیفر) پادشای (عومان) و (بەحرین) و (عوباد)ی برای بۆ ئیسلام, عەمر بە بچووکەکەیان(عوباد) دەستی پێکرد, ئەمەش زیرەکی و زرنگی عەمر دەردەخات, چونکە بچووك هەردەم نزیکترە بۆ ئەوەی کە باش گوێ بگرێت و گوێڕایەڵبێت, (عوباد) قەناعەتی کرد و موسوڵمان بوو, پاشان عەمر چووە لای (جیفر)و بانگەوازی کرد بۆ ئیسلام, بینی کە کەللەڕەق و توندە, عەمر بەردەوام بوو لە گفتوگۆکردن لەگەڵیدا بە زیرەکی و نەرمونیانی هەتا ڕازیکرد, بەم شێوەیە (عومان) و (بەحرین) بەبێ جەنگ هاتنەناو ئیسلامەوە, پاداشتی ئەم سەرکەوتنەش ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەرپرسیارێتی کۆکردنەوەی زەکاتی (عومان) و (بەحرینی) پێبەخشی, لە دەولەمەندانی وەردەگرت و دەیگێڕایەوە بۆ هەژاران, خۆشی وەکو کەسێك لەوانەی کە کارییان لەسەری دەکرد(العاملين عليها) بەشی هەبوو.

## عەمر لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا
## ( مورتەدین )

عەمر بەردەوام بوو لە بەرپرسیارێتی کۆکردنەوەی زەکاتی عومان و بەحرین, هەتا پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد و أبو بکر بوو بە خەلیفە, ئیتر هەندێك لە تیرە عەرەبییەکان لە ئیسلام پاشگەزبوونەوە و ڕێگری زەکاتیان کرد, و جەنگیان دژ بە جێنشینی پێغەمبەری خودا ڕاگەیاند, کە (قضاعة)ش یەکێك بوو لەو تیرانە, أبو بکر یانزە لیوای ئامادە کرد بۆ جەنگ و کوشتاری مورتەدان, وە عەمری کرد بە ئەمیری یەکێك لەو لیوایانە, و فەرمانی پێکرد کە بچێت بۆ لای هۆزی (قضاعة) بۆئەوەی جەنگیان لەگەڵدا

بکات و بیانگێڕێتەوە بۆ ئیسلام, عەمریش بە باشترین شێوە هەستا بەم کارە, و لە تەمبێکردن و جەنگی (قضاعة)دا بەڕاستی تووشی بەلا و تاقیکردنەوە بوو, بەلام نەگەڕایەوە دواوە هەتا بەڕاستی موسوڵمان بوون و زەکاتیان دا و گەڕانەوە ناو چوارچێوەی ئیسلام.[٨]

## جیهادی عەمر لە خاکی شام

دوای دامرکاندنەوەی فیتنەی مورتەدان خەلیفە أبو بکر ڕەزای خوای لەسەربێت بیری دەکردەوە کە سنوورەکانی دەوڵەتی ئیسلامی پارێزراو بکات, و ولاتەکانی تریش ڕزگاربکات, ئەمە لە کاتێکدا کە ڕۆمەکان لە شامەوە هەڕەشە بوو بۆ سەر دەوڵەتی ئیسلامی, و بیریان دەکردەوە کە هێرش بکەنە سەری, بۆیە خەلیفە ئەبو بەکر چوار سوپای ئامادە کرد, کە هەریەکەیان لە هەشت هەزار جەنگاوەر پێکهاتبوو, لەسەر هەر یەکێکیان سەرکردەیەکی دانا, و کارێکی پێسپارد, عەمریش یەکێك بوو لە سەرکردەکان و ڕزگارکردنی (فەلەستین)ی پێسپێردرا, بەلام کاتێك چوار سوپاکە گەیشتنە خاکی شام بینییان کە ڕۆمەکان کۆبوونەتەوە لە شوێنێك لە نزیك (الیرموك), ژمارەشیان لە دووسەد هەزار جەنگاوەر زیاتر بوو, عەمر پێی

---

[٨] ) سالی ١١ بۆ ١٣ی کۆچی لە مێژووی ئیسلامیدا بە سالی هەلگەڕاوەکان لە خەلیفەی موسوڵمانان ناسراوە، پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەندێك لە تیرو هۆزەکانی عەرەب لەسەر ئەوە پێك هاتن کە زەکات نەدەنە خەلیفەی موسوڵمانان، لەبەر ئەمەش خەلیفەی موسوڵمانان فەرمانی جەنگی لەگەڵ کردن، ئەمەش لەبەر ڕۆشنایی فەرموودەکەی: ((أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسول الله ، ويقيموا الصلاة ، ويؤتوا الزكاة ، فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحق الإسلام ، وحسابهم على الله)).[٨] واتە : خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم کە دژی هەموو خەلکی بجەنگم (شەڕ بکەم) هەتا شایەتی دەدەن کە هیچ خوایەك نییە بەهەق جگە لە (الله) ، وە (محمد)یش بەندە و پێغەمبەری ئەوە ( واتە هەتا تەوحید بەرقەرار دەبێت لە سەر زەویدا) و ، نوێژ بکەن و ، زەکات بدەن ، ئەگەر ئەوان ئەوەیان کرد ئەوە خوێن و ماڵیان پارێزراوە مە گەر بەحەقی ئیسلام نەبێت ، وە لێپرسینەوەو حسابیشیان لای خوای گەورەیە لێیان خۆش دەبێت یان نا)). (متفق علیه).

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی فەرموودەکە دەفەرموێت:

(( فيه وجوب قتال مانعي الزكاة أو الصلاة أو غيرهما من واجبات الإسلام قليلا أو كان كثيرا)). واتە: ئەم فەرموودە بەلگەیە لەسەر واجبی شەر و قیتال دژی ئەو کەسانەی کە زەکات نادەن، یان نوێژ ناکەن، یان هەرکام لە واجباتەکانی دیکەی ئیسلام بەجێ ناهێنن، جا کەم بێت یان زۆر )). ئەمەش کاتێك کە ئیمامی ئەبو بەکر خوای لێ ڕازی بێت فەرمووی: (( لو منعوني عقالا أو عناقا )).

وابوو کە هەموو سوپا ئیسلامییەکان دەبێت یەکبگرن و داوای یارمەتیش لە خەلیفە بکەن, سەرکردەکانی سوپاکە بەمە ڕازی بوون, خەلیفە ئەبو بەکریش چوار هەزار جەنگاوەری بۆ ناردن بە سەرکردایەتی هاوەڵی ئازا و چاونەترس (خالدی کوڕی الولید), ئیدی جەنگ و کوشتار لە نێوان موسوڵمانان و ڕۆمەکاندا ڕوویدا لە جێگای بەناوبانگی (الیرموك)دا, هەرچەندە عەمری کوڕی العاص فەرماندەی گشتی سوپاکە نەبوو، بەلام لەم جەنگەدا ڕۆڵێکی زۆر گەورە و دیاری هەبوو, ، وە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ موسوڵمانان بەدەستهات لە (الیرموك)دا, ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ ڕزگارکردنی خاکی شام لە دواتردا بەتەواوەتی, دوای تەواوبوونی جەنگی (الیرموك) هەواڵی کۆچی دوایی خەلیفە ئەبو بەکر هات و عومەری کوڕی خطاب بوو بە خەلیفەی موسوڵمانان, ئیمامی عومەر نێرراوێکی نارد و داوای لە عەمر کرد کە ڕزگارکردنی فەڵەستین تەواو بکات, کە فەرمانڕەواکەی پێی دەوترا (أرطبون), ئیمامی عومەر وتە بەناوبانگەکەی فەرمووی: ((رمينا أرطبون الروم بأرطبون العرب)) ، عەمر لەگەڵ هەشت هەزار سەرباز هەستان بە ڕزگارکردنی گشت کەنار دەریاکانی فەڵەستین, شارەکانی (قنسرين) و (حلب) و (أنطاكية) و (قيسارية) ڕزگارکران, پاشان گەیشتنە (غزة) و حاکمە ڕۆمانییەکە هەواڵی نارد بۆ عەمر بۆئەوەی پیاوێك بنێرێت هەتا قسەی لەگەڵ بکات, عەمر خۆی بەشێوەیەکی شاراوە چوو بۆ لای, و قسەی لەگەڵدا کرد بێ ئەوەی پێی بلێت کە ئەو سەرکردەی سوپاکەیە, فەرمانڕەوای ڕۆمەکان زۆر سەرسام بوو بە قسەکردن و ڕەوان بێژییەکەی, خەڵاتێکی پێدا و هەواڵی دا بە دەرگاوانەکان بۆئەوەی کە گەیشتە دەرگاکە بیکوژن و چیشی پێیە بیبەن, کاتێك لەلای چووە دەر, ڕۆیشت بەلای پیاوێکی گاوردا(غسان)کە دەیناسی, پێی وت: ئەی عەمر زۆر بە باشی هاتوویتە ژوورەوە بە باشیش بڕۆرە دەرەوە. عەمر لە وتەکەی تێگەیشت و گەڕایەوە بۆ لای فەرمانڕەواکە, و پێی ڕاگەیاند کە زۆر بە خەڵاتەکە سەرسام بووە, بەڵام بەشی ئامۆزاکانی ناکات کە ژمارەیان دە کەسە, وە داوای لێکرد کە بچێت و هەموویان بهێنێت و بۆ ئەوەی دیارییەکی لەم جۆرە بە هەریەکەیان بدات, فەرمانڕەواکە زۆر ڕازی و دڵخۆش بوو, بە هەلێکی باشی دەزانی بۆئەوەی دە کەس بکوژێت لەبری یەك کەس, فەرمانی کرد بە دەرگاوانەکان کە وازی لێ بهێنن, ئیتر عەمر بەسەلامەتی لە شارەکە دەرچوو بەهۆی ئەم فێڵە زیرەکانەیەوە, پاشان سەرکردایەتی سوپاکەی کرد و غەززەی ڕزگارکرد, دواتریش (بيت المقدس) بە ئاشتی(صلح) بە ئامادە بوونی خەلیفە(عمری کوڕی الخطاب) ڕزگارکرا پاش ئەوەی کە فەرمانڕەوا ڕۆمانییەکەی هەڵهاتبوو بەرەو مصر.

# ڕزگارکردنی مصر

دوای ئەوەی کە خاکی شام بەتەواوەتی ڕزگارکرا عەمر ڕەزای خوای لەسەربێت چاوی لەسەر ڕزگارکردنی مصر بوو, بۆیە هەواڵی نارد بۆ أمیر المؤمنین (عمری کوڕی الخطاب) و داوای دەکرد کە ڕێگەیان پێبدات بۆ ڕزگارکردنی مصر, عومەری کوڕی خەتاب سەرەتا دوودڵ بوو لەترسی گیانی موسوڵمانان, بەڵام عەمر ڕازی کرد بەوەی کە ئامانج لە ڕزگارکردنی مصر دوورخستنەوەی ترسە لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی, و بەتەواوەتی کۆتایی هێنانە بە ڕۆمەکان هەتاوەکو دووبارە بیر لەگەڕانەوە نەکەنەوە بۆ شام.

ئیتر ئیمامی عومەر ڕازی بوو, وە ڕێگەی پێدا بۆ ڕزگارکردنی مصر, بەڵام پێی ڕاگەیاند کە نامەیەکی تریشی بۆ دەنێرێت لەکاتێکدا کە ئەو لە ڕێگەدایە, و ئەگەر لە کاتی گەیشتنی نامەکەدا گەیشتبووبێتە ناو خاکی مصر ئەوا بەردەوام بێت ئەگەرنا با بگەڕێتەوە, عەمر سوپاکەی جوڵاند, وە شارەزاش بوو بە مصر و خەڵکەکەی چونکە زۆر سەفەری بۆ کردبوو, لە ڕێگەی کەنار دەریاوە چوو بەرەو (العریش), وە زانیشی کە نامەکەی عومەر گەیشتووە, بەڵام بینینی نێرراوەکەی دواخست هەتا گەیشتە ناو سنوورەکانی مصر, وە عەمر لە (العریش)دا کەسی نەبینی لە ڕۆمەکان کە بەرگری بکەن, بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن هەتا گەیشتە "الفرما"(ئیستا پێی دەوترێت بور سعید), ئابلوقەی دا و لە ماوەی کەمتر لە دوو مانگدا ڕزگاری کرد, وە بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن هەتا گەیشتە (بلبیس) لەوێدا سوپای ڕۆمەکان ڕووبەڕووی بوونەوە بە ژمارەیەکەوە کە سێ هێندەی سوپای موسوڵمانەکان دەبوو, بەڵام بە یارمەتی خودا تێکیانشکاندن, پاشان عەمر لە ڕێگەی بیابانەوە چووە ناو " أم دنین "( ئیستا پێی دەوترێت الأزبکیة) و دەستی بەسەردا گرت, و تێی پەڕاند هەتا گەیشتە مصری کۆن لای قەڵای" بابلیون "(ئیستا پێی دەوترێت الفسطاط), ئابلوقەی شارەکەی دا, بەڵام ئەو هۆکارە سەربازییانەی کە بەدەستی موسوڵمانانەوە بوو لەوە لاوازتربوو کە یارمەتییان بدات بۆ شکاندنی ئەو قەڵا بەهێز و پتەوە, بۆیە عەمر کەتیبەیەکی بەجێهێشت بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لە ئابلوقەی قەڵای بابلیون, وە باقی سوپاکەی برد بەرەو (صعید مصر)و دەوروبەری(الفیوم), وە چۆن بیویستایە نەخشەی جەنگەکەی دەگۆڕی و ئاڕاستەی دەکرد, و پیلانی ڕۆمەکانی تێکدەدا, و ناچاری دەکردن بە گۆڕینی سەربازگەکانیان لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی تر.

ئابلوقەی موسوڵمانان بۆ سەر قەڵای بابلیون درێژەی کێشا, ئەمە خەلیفەی دوودڵ کرد, بۆیە هەشت هەزار سەربازی نارد بۆ یارمەتی عەمر کە لەنێویاندا (الزبیری کوڕی العوام و القعقاعی کوڕی عەمرو)هەبوو, الزبیر و چەند سەربازێك توانییان دیواری قەڵاکە إقتحام بکەن و دەرگاکە بکەنەوە, و موسوڵمانان چوونە ناو قەڵای (بابلیون)ەوە, و بەسەر ڕۆمدا سەرکەوتن لەو شوێنەدا کە بە گرنگترین جەنگی موسوڵمانان دادەنرێت دژ بە ڕۆمەکان لە خاکی مصردا, کە لە ڕووی گرنگییەوە هیچی لە جەنگەکانی **(الیرموك** و **القادسیه)** کەمتر نییە, چونکە جەنگێکی یەکلاییکەرەوە بوو لە ڕووخانی ڕۆم و سەرکەوتنی موسوڵمانان و ڕزگارکردنی مصر, دواتر عەمر بەرێکەوت بۆ ئابلوقەدانی (الاسكندرية) و ڕزگارکردنی, و ڕزگارکردنی گشت شارە کەناردەریاییەکان, هەتا بەتەواوەتی مصری ڕزگارکرد لە یەکی (محرم)ی ساڵی ٢١کۆچی (کانونی یەکەمی ساڵی ٦٤١زایینی).

## یەکەمین ئەمیری مصر

دوای ئەوەی کە عەمر خاکی مصری ڕزگارکرد خەلیفە عومەر ڕەزای خوای لەسەر بێت کردی بە ئەمیری ئەوێ, عەمر لەگەڵ خەڵکەکەیدا زۆر ڕەفتاری جوان و بەرز بوو, کە گەواهیدەر بوو لەسەر سنگفراوانی و لێبووردەیی ئیسلام, بە جۆرێك کە ئازادی کردن لە پەرستندا, و کەنیسە و پەرستگاکانی پاراست, هەروەکو چۆن مزگەوتی دروستکرد(جامع عمرو) لە (الفسطاط)دا کە کردبوویە پایتەختی مصر, و لەنێوان خەڵکیدا دادپەروەری بەرپاکرد, کە بووە هۆی ئەوەی خەڵکی هەردەم زمانیان بە سوپاس و ستایش بگەڕێت, و خەڵکی پۆل پۆل دەهاتنە ناو دینی خواوە بە هۆی خۆشەویستی و ڕازیبوونیان لە ئیسلام, و عەمر هەستا بە چەندین کاری کارگێری و چاکخوازی لە میصردا, پێوانەی (حەلوان) و پێوانەی (أسوان)ی دروستکرد, خۆی چاودێری دروستکردنی جۆگە و پردەکانی دەکرد, و ئاسانکاری دەکرد لە گشت باجەکان و سەرانەی زەوی, و دابەشی دەکرد بەسەر سێ بەشدا لەساڵەکەدا, و بەشی نەخۆش و پەککەوتەی لێدەدا, و هەروەها لەسەردەستی ئەودا ئەو کەنداوە ڕزگارکرا کە پێی دەوت کەنداوی(أمیر المؤمنین) لە نێوان نیل و دەریای سووردا, کە ڕاڕەوێکی زۆر باش بوو بۆ کەشتی لە نێوان مصر و حیجازدا, عەمر بەوە ناسرابوو کە زۆر بەسۆز و میهرەبان بوو لەگەڵ خەڵکەکەیدا بەگشتی, بەجۆرێك کاتێك ویستی شاری

(الفسطاط) دروست بکات, بینی کە کۆترێك هێلانەیەکی دروستکردووە لەسەر چادرەکەی, داوای کرد کە چادرەکە بمێنێت هەتا بێچووەکانی گەورە دەبن و لەسەریان دەفرێت, بەڵام ئەو ڕووداوەی کە کورەکەی لە (قیبطي)ەکەی دابوو(کە ئەو مصرییە پێش کورەکەی عەمر کەوتبوو لە پێشبرکێی ساڵانەی ئەسپسواریدا, وتبووی: ئایا پێش کوڕی بەڕێزەکان دەکەوی؟!پاشان لێی دابوو) ئەوە ڕووداوێکی تاکەکسی بووە, و مێژووش ئەوە دەسەلمێنێت کە عەمر بە ڕووداوەکەی نەزانیوە هەتا ڕووداوەکە گەیشتووەتە لای خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب, خەلیفەش دادپەروەرانە تۆڵەی بۆ (قیبطي)یەکە سەندەوە, و هەرگیز باسیشش نەکراوە کە عەمر دواتر سزای (قیبطي)ەکەی دابێت یان سەرزەنشتی کردبێت, بەڵکو دادپەروەر بووە لەگەڵیدا و لەگەڵ گشت خەڵکی مصردا.

## دابڕانی عەمر و گەڕانەوەی

عەمری کوڕی العاص وەکو والی مصر مایەوە هەتا الفاروق(عمری کوڕی الخطاب)شەهید بوو, و (عوثمانی کوڕی العفان) ڕەزای خوای لەسەر بێت بوو بە خەلیفە, و عەمری دوورخستەوە و (عبد الله کوڕی سەعد کوڕی أبي سرح)ی خستە شوێنی, بۆیە عەمر چوو بۆ فەڵەستین و لەوێ نیشتەجێبوو, و خواپەرستی دەکرد و لە ژیانی سیاسی دوورکەوتەوە, عەمر چەند ساڵێکی زۆری لە فەڵەستین بەسەربرد, هەتا فیتنەیەکی گەورە هەڵگیرسا کە هەندێك لە دووڕوو و جوولەکە و دوژمنانی ئیسلام لە پشتییەوە بوون, خەلیفە عوثمان ڕەزای خوای لەسەر بێت شەهید بوو، وە لەم فیتنەیە دەربازی بووو, و ململانێ لە نێوان (علي کوڕی أبو طالب و موعاویة کوڕی أبو سفیان) ڕەزای خوایان لەسەربێت دروست بووو, موعاویە هەواڵی نارد بۆ عەمر و داوای لێکرد کە پشتی بگرێت دژ بە ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لەسەر بێت, وە بەڵێنیشی پێدا کە دووبارە کاروباری مصری پێ بسپێرێتەوە, عەمریش ڕاوێژی بە دوو کوڕەکەی کرد(عبدالله و محمد), عبدالله پێی وابوو کە دەبێت ئەم داواکارییە ڕەتبکاتەوە, بەڵام محمد ڕازیبوونی پێ باش بوو, عەمر دوودڵ بوو لەم کارەدا, دواتر بڕیاری دا بچێتە پاڵ معاویە, وە لە جەنگی (صفین)دا بە شێوەیەکی کرداری چووە پاڵی, هەر ئەویش بوو پێشنیاری ئەوەی کرد کە (مصحف)ەکان بخرێنە سەر نێزەی ڕمەکان کاتێك بینی کە سوپاکەی

ئیمامی عەلی خەریکە سەردەکەوێت, هەروەك چۆن جێگری معاویە بوو لە دەسەڵاتدا, دواتر خیلاف لە سوپاکەی ئیمامی عەلیدا زیادی کرد و کۆمەڵێکی لێ دەرچوون و کە بە (الخوارج) ناسران, سێ کەس لە الخوارج  ویستیان ئیمامی عەلی و عەمر و معاویە بکوژن, ئەوەبوو ئیمامی عەلی شەهیدکرا و بکوژەکەی معاویە بە باشی نەیپێکا و تەنها تووشی برینێکی ئاسان بوو کە چاك بووەوە, و عەمریش ئەو شەوە نەچووبوو بۆ نوێژ و لە جێی ئەو (خارجة کوڕی حزافة) چووبوو , ئەویش کوژرا, بکوژەکەی وتی: من ویستم عەمر بکوژم خوای گەورەش ویستی لە خارجە بوو, کارەکەش بەوە کۆتایی هات کە معاویە بوو بە خەلیفەی موسوڵمانان و بەڵێنەکەشی بۆ عەمر بەسەر برد و دووبارە کردییەوە بە والی مصر, عەمریش دادپەروەری و میهرەبانی و خۆشەویستی بەخشی بە خەڵکی, و خوای گەورە خێر و گەشەسەندنێکی زۆری لەسەر دەستیدا هێنا.

## کۆچی دوایی عەمر

عەمر بۆ ماوەی سێ (٣) ساڵ فەرمانڕەوایی خاکی مصری کرد پاش گەڕانەوەی هەتا هەشتا ساڵی لە تەمەنی تێپەڕاند, و توشی نەخۆشی بوو(نەخۆشی مەرگ), عەمر گریا و چاوی بە دیوارەکاندا گێڕا, و بیری دەکردەوە لە موسوڵمان بوونی, و لە جیهاد کردنی لەگەڵ پێغەمبەری خوا و خەلیفەکانیدا, وە خۆزگەی دەخواست کە بریا بمردایە پێش ڕوودانی فیتنەکە, پاشان چاوی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و بەدەم گریانەوە, وە وتی: **((خوایە گیان بەهێز نیم سەرم بخە, وە بێتاوان نیم لێم خۆش بە, خوایەگیان خۆبەزلزان نیم, بەڵکو داوای لێخۆشبوون دەکەم, خۆ ئەگەر سۆز و میهرەبانی تۆ نەبێت ئەوا لە تیاچووەکان دەبم))**.پاشان دەستی کرد بە وتنی (لا إله إلا الله) و بەردەوام بوو لە دووبارەکردنەوەی هەتا وەفاتی کرد, ئەمەش لە شەوی جەژنی ڕەمەزانی ساڵی (٤٣کۆچی) بەرامبەر (٦٦٤زایینی), و لە پەنای کێوی (المقطم)دا لە (القاهرة) نێژرا.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله صحبة وسلم




ماڤی لەبەرگرتنەوەو بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی پێگەی گزنگ پارێزراوە

بۆ هەموو موسوڵمانێک